
تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
دارستانەکە
٣
کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵان
فیلۆکە
خۆی دەشوات
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: پەریان ئەحمەد زەردەشت
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور




# فیلۆکە

## خۆی دەشوات



ناوی کتێب: فیلۆکە خۆی دەشوات
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: پەریان ئەحمەد زەردەشت
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوەی: دەزگای بوراق بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: فیردۆس مونعیم
ڕەنگی ژمارەیی: مەریەم موحسین
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٤٢-٨
چاپی یەکەم ٢٠١١













**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤٠٨) ساڵی ٢٠٠٩**
Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com



لە دارستانێکی گەورە و قەشەنگدا، فیلێکی بچووک لەگەڵ دایک و باوکیدا دەژیا، بە فیلۆکە بەناوبانگ بوو..

فیلۆکە لە هیچ کارێکدا ڕێکوپێک نەبوو، کاتی نان خواردن جلەکانی پیس دەکرد و بە هەمان شێوە کە دەچووە دەرێ لەگەڵ بێچووی ئاژەڵاندا یاریی دەکرد، هیچ بایەخی بە پاک و خاوێنی جلەکانی نەدەدا، کاتێکیش دایکی چاوی بەو بارە دەکەوت دڵگران و غەمبار دەبوو..



دایکـی هەمـوو ڕۆژێک ناچار دەبـوو جل و کەلوپەلەکانی بشـوات، بەڵام کە دەیویسـت بیشـوات، دەکەوتـە نـەڕە نـەڕ و ئوقرەی نەدەگـرت، کاتێکیـش فیلۆکە لـە قوتابخانە دەگەڕایـەوە جلەکانی بـەملا و بەولادا فڕێ دەدا و لـە شـوێنی تایبەتـی خۆیـدا هەڵـی نەدەگرتـن، دایکی زۆر ئامۆژگاری دەکرد و پێـی دەگوت: فیلۆکـە ئازیزەکەم کاتێک کە نان دەخۆیت، یا خود یاری دەکەیت، یا کە لە قوتابخانە دەگەڕێیتەوە دەبێ بایەخ بە خۆت بدەیـت، بەڵام قسـەکانی دایکـی لەگوێ نە دەگرت...

دایکـە بیـری لـە ڕێبازێک کـردەوە کە وانـەی فیلۆکـە دەدات و بیخاتە سـەر ڕێگای ڕاسـت و بایەخ بە خۆی بدات و واز لەو ڕەوشتە ناهەموارانە بێنێ.



بـۆ ڕۆژی ئاینـدە، کاتێـک لـە قوتابخانە گەڕایـەوە، وەک جاری جاران جل و جانتاکەی بەملاو ئەولادا فڕێ دا و ڕووەو چێشـتخانەکەیان بووەوە تـا قاپاروویەک بخوات، پێی لە یاری و بووکە شووشەکانی خـۆی گلاوکـەوت بـە زەویـدا، فیلۆکـە بـە ئـازارەوە هەڵسـایەوە و سـەیری کـرد یەکـێ لە یارییەکانی شکا..

پێی سسـت بوو، زۆر خەمی خوارد و بە سەرسوڕمانێکەوە لەبـەر خۆیەوە وتـی: بـۆ وەک ڕۆژان ماڵەکەمان پاک و تەمیز و ڕێکوپێـک نەبـوو؟ بۆچی یارییەکانم هەر بڵاون وکۆ نەکراوەتەوە؟



لە ژووری نان خواردن سەیری کرد قاپ و قاچاغەکان پاک نین و مێشیان لێنیشتووە، لە لایەکی چێشتخانەکەدا، باوک و دایکی نانیان دەخوارد، سڵاوی لێکردن، دایکی وتی: ئازیزم گەر برسیتە ئەوا قاپێک بێنە تا خواردنت بۆ تێبکەم، بە ڵام فیلۆکە هیچ قاپ و پەرداغێکی پاکی نەدۆزییەوە!!



فیلۆکە وتی: دایکە هیچ قاپێکی پاک نییە...!!
دایکی وەڵامی دایەوە: تۆ گوێ نادەیتە
پاکی، هەر قاپێکی بەکار هێنراوم بدەرێ
کە دوێنێ شەو نانمان تیا
خواردووە، تا شێوت بۆ
تێکەم..!!
فیلۆکە ویستی قاپێک
بێنێ سەیری کرد
پڕە لە مێش، لەم
دیمەنە ناڕەحەت
بوو، خەم دایگرت...
ئەگەر چی زۆریش
برسی بوو..!



وتی: دایکە برسیم نییە و دەمەوێ تۆزێ یاری بکەم.

پاش چەند کاتژمێرێک لە یاری گەڕایەوە دەست و دەم و چاو و جلەکانی زۆر پیس کردبوو، ئەو شەوە فیلۆکە دەیویست بچێت بۆ ئاهەنگی جەژنی لە دایکبوونی یەکێ لە هاوڕێیەکانی، ویستی جلەکانی بگۆڕێ، بەڵام هەموویان پیس بوون، هاواری کرد.. دایکە.. دایکە..!!

دایکی هات، فیلۆکە وتی: ئەمشەو دەمەوێ بچم بۆ ئاهەنگی ئەو هاوڕێیەم، بەڵام هیچ جلێکی پاکم نییە، چی بکەم؟



دایکە وتی: خەتای خۆتە.. بۆچی هەموو ڕۆژێک جلەکانت پیس دەکەیت و بایەخیان پێ نادەیت و ئاگاداریان ناکەیت، چ لەکاتی نانخواردن و چ لە یارییدا..!!؟ پاک و تەمیزی بەلای تۆوەوە گرنگ نییە، ئەگەر چی جلەکانی بەرت پیسن بەڵام هەر بەوانەوە بچۆ...!!

فیلۆکە بیری کردەوە، لە بەر خۆیەوە وتی: بەڵێ بەم جلانەوە دەچم، من شادومان و بەختەوەرم کە دایکم پێی نەگووتم بچۆ خۆت بشۆ، دەسا تا زووە با بڕۆم...



هەموو هاوڕییەکانی بە جلی پاکەوە هاتن بۆ ئاهەنگەکە.. تەنانەت لەش و دەس و دەم و چاویشیان پاک و خاوێن بوو، هەمووان یارییان دەکرد، کاتێکی خۆشیان بەسەر دەبرد، فیلۆکە سڵاوی لێکردن و داوای کرد لەسەری بکەن، بەڵام هاوڕییەکانی کاتێک بەو شێوە پیس وچەپەڵییە دییان، لێی دوور کەوتنەوە، ئەوەتا کەس نایەوێ یاری لەگەڵدا بکات، هەندێکیشیان گاڵتەیان پێ دەکرد، فیلۆکە زۆر دڵگران و زویر بوو، بە دڵشکاوییەوە گەڕایەوە ماڵی، دایکی لێی پرسی، بۆچی وا زوو گەڕایتەوە؟! فیلۆکە چی ڕوویدا؟

فیلۆکە بە گریانەوە بە دایکی گوت: هیچ هاوڕێیەکم خۆشی ناوێم، گاڵتەم پێدەکەن، چونکە چەپەڵم، لەوکاتەدا ویستی بچێ بۆ ناو جێگا، تا لەوێ بگری، دیسانەوە پێی لە یارییەکی خۆی گلایەوە و کەوت بەزەویدا کەوتە زووڕەزووڕ، دایکی دانەوێوە و بەسۆزەوە گرتیە ئامێز و پێی گوت: فیلۆکە چەند جار ئامۆژگاریم کردوویت بووک و یارییەکانت وا بە بڵاوی بەجێ مەهێڵە، بەڵام ئازیزە بچکۆڵەکەم گوێت نەدایە قسەکانم





دەمزانی کە هاوڕێکانت لەو ئاهەنگەدا یاریت لە گەڵدا ناکەن چونکە چەپەڵ بویت، ئەوەتا کەس منداڵی پیسی خۆش ناوێ، دایکی وتی: خۆشەویستم مەگری، گەر پاک و خاوێن و ڕێکوپێک بیت ئەوا هەمووان خۆشیان دەوێیت. دەبا بچین بتشۆم و جلی پاکت لەبەرکەم تا بگەڕێیتەوە و بەشداری یاری هاوڕێکانت بکەیت.

فیلۆکە زۆر خۆشحاڵ بوو، بە دایکی گوت: بەڵێن بێ ئیتر پاک و ڕێکوپێک دەبم. خۆی شت و دایکی جلی پاکی لەبەر کرد و بردییەوە بۆ ئاهەنگەکە، کە هاوڕێ بچوکەکانی بەو شێوە جوان و پاک و ڕێکوپێکە دییان، پێشوازییان لێکرد و داوایان لێکرد بەشداری یارییەکانیان بکات، فیلۆکە لە خۆشیدا شامەرگ بوو، لەبەر خۆیەوە وتی:

گەر ڕۆژانە پاک و خاوێن و پوختە بم، ئەوا هەموو دانیشتوانی دارستانەکە بە گەورە و بچووکیانەوە دەبنە هاوڕێم... ئیتر کەوتە یاری و پێکەنینیان لەهەموو سوچێکی دارستانەکەوە دەبیسترا..



**ئەمە لەبەر کە**

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ

## "پاک و خاوێنی لە باوەڕەوەیە"

یەزدانی مەزن و پێغەمبەری (د.خ) ڕاسپاردەی پاک و خاوێنیمان دەکەن. ئەوەشمان زانی کە چۆن فیلۆکە بایەخی بە پاک و خاوێنی نەدەدا بەڕادەیەک برادەرەکانی لێی تەکینەوە، کاتێکیش زانی کە پاک و خاوێنی گرنگە، بە قسەی دایکی کرد. ئەوە بوو هەمووان یارییان لەگەڵدا کرد و پێشوازییان لێکرد.

## فیلۆکە

دەتوانی لەو چوار گۆشەیەدا دوو فیل بگوێزیتەوە، تا هەر دوو کۆمەڵەی ژمارە (١،٢) هاوشێوە و یەکسان بن.






